# ئەفریقانامە

## بە تامی شیعر




پێشەوا کاکەیی




## نێوی کتێب: ئەفریقانامە، بە تامی شیعر
## بابەت: شیعرو پەشخان
## نووسەر: پێشەوا کاکەیی
## پڕۆژەی یەکەم

دیزاین و ئامادەکردنی
ایبراهیم صاڵح

f.b Ebrahem Salh



1--

له هەرێمە کاولکراوەکەی خۆمەوە، دەڕۆم... تاکوو، ئەفریقانامە بنووسمەوە.
بێئەوەی خاک و ئاسمانی عەرەبستانی سعوودی بگرمەوە.
ناشمەوێت: بە لای کوێتی بێدەنگدا تێپەڕم،
وەک ئەو مارەی کیف لەسەر جادە بە جێدێڵێت و دەبریسکێتەوە.
یان، قەتەڕی سەرسووڕهێنەری پلاندانەری ئاژاوەگێڕ، ببینمەوە.
نە بەحرێنی دوو هەوێ و، نە یەمەنی دوو خەسوو و،
نە عومانیش، بە چاوێکی شانشینە بازرگانەکانی ئیمارات ببینمەوە.
لە پەسابەندەری ئێرانەوە، بە بەلەمێکی بچووکی ئەسغەری هاوڕێم دەپەڕێمەوە.
یەکەم شوێنیش کە بۆی دەچم: جیبۆتی دەبێت و، ماوەیەک لێی دەمێنمەوە.
لەگەڵ منداڵەکانی وێ: بە هەردوو زمانی عەفاریی و سۆماڵی'1'، ئاخاوتن دەکەمەوە.

---------------------

'1'. عەفاری و سۆماڵی: پێشتر خەڵکی جیبۆتی، بەو دوو زمانە ئاخاوتنیان کردووە، کە ئەم دوو زمانە، سەر بە هەردوو نەتەوەی عەفاریی و سۆماڵیین.



خۆ هێندە خۆشە، وەکوو ئەو دێهاتییانە، بە جلێکی سوننەتییەوە بگەڕێیت.
لە بری هۆڕنە: گوێت لە هۆقەی گامێش بێت.
شەوێکیش لە ئەسمارا نامێنمەوە.
لە دێهاتێکی نزیک وێ: سەرقاڵ دەبم بە پەمۆ چنینەوە.
بە تیگرینییەکی'2' پەتی، بەو کچە لیچ ئەستوورە دەڵێم:
با پێکەوە، قاوەیەک بە تامی وڵاتەکەت بخۆینەوە!.

-----------------------

'2'. تیگرینی: زمانی نەتەوەی تیگرینیایە و، زمانێکە لە بنەماڵەی زمانە سامییەکان. لە ئێریتریا و ئەسیوپیا، قسەی پێ دەکرێت. یەکێکیشە لە زمانە فەرمییەکانی ئێریتریا.



غلۆر بوومەوە بەرەو ئەسیوپیا،
لە دەرگای مرۆڤایەتییم دا:
کە چوومە ژوور، کۆنترین ئێسکوپروسکم تێدا دۆزیەوە.
دەستبەجێ، نامەیەکی مێژوویی، بە ڕێنووسی گەعزم'3' نووسی و،
بە جێمهێشت، بۆ وەی هەرکەس هاتّ، لە یەکەم شارستانێتیی بکۆڵێتەوە.
ئەو وەختەش کە چوومەوە، هەندێکیان لە ڕقان،
پێیان دەگوتم : کاکی حەبەشە بەخێرێیتەوە!.

-------------------

' 3'. گەعز: ڕێنووسێکی کۆنە و، بۆ زمانەکانی گەعزی و ئەمهەری و تیگرینی وەکار دێت.



هیچ خۆشییەک نابینم لەو مۆگادیشۆیە'4'
چەتەکانی دەریا، وەک ئەوانەی لای خۆمان،
کەرامەتی نیشتمانەکەیان، بە بەرچاوی وڵاتانەوە شکاندووە.
گەر بڕوا ناکەن، سەیری چزدانەکەتان بکەن:
بزانە، لە سایەی نەوت و دەوڵەتەوە، چەندی تێدا ماوە!.

--------------------

'4'. مۆگادیشۆ: پایتەختی وڵاتی "سۆماڵیا"یە.



لە شوێنی وەستانی شەمەندەفەرەکە بووم، لە مۆمباسا،'5'
چاوەڕێم دەکرد: ئامینە کینیایی'6 '، بگەڕێتەوە لە ئۆگەندا.
تاکوو بچینە دامێنی شاخی کلیمانجارۆ'7'، باسی مۆسیقا بکەین.
کەچی چەکدارێک لە نێویاندا، هەمووی بە دیل گرتبوون.
ویستبووی شۆڕشی مائوو مائوو'8'، هەڵگیرسێنێتەوە، بۆ یاخیبووان.
کە ئامینەی بینی بوو، چەکی دانا و دەستیدایە گیتار،
دوای ماوەیەک بوو بە مۆسیقار!.
سێ قۆڵی چووینە ماسای'9'، لە بەردەم خەڵکانی وێدا:
بە تەنیا، دەستمکرد بە ژەنینی تار!.

------------------------

'5'. مۆمباسا: دووەمین شاری پڕ دانیشتوانی کینیایە.  نێوەندی شاری پیشەسازیی و گەشتیارییە. بەسەر زەریای هینددا دەڕوانێت.
'6' . ئامینە کینیایی: پێشکەشکاری بەرنامەیەکی هونەرییە، تایبەت بە گۆرانی و مۆسیقا، لە: کینیا.
'7'. کلیمانجارۆ: بەرزترین لوتکەی شاخی ئەفریقایە. دەکەوێتە: وڵاتی تانزانیا و، ئەو شاخەش، سنووری نێوان وڵاتی کینیا و تانزانیایە. کە بەرزییەکەی دەگاتە: 5895م.
'8'. مائوو مائوو: شۆڕشێکی چەکداری بوو، لە نێوان بەریتانیا و کینیا. لە ساڵانی (1952-1960). لەو شەڕەدا: نزیکەی: 12 هەزار کەس کوژرا. لە: 12/12/ 1963 کینیا، سەربەخۆیی وەرگرت لە بەریتانیا.



وەک زەنگبارییی و تانگانیکایی'9'،
بە  زمانی سەواحیلی، بە یەکدی دەڵێین: دادا و کاکا.'10'
وەرن با لە تانزانیادا یەکبگرینەوە.
ڕابردوومان، وەک گەڵای تووتن بە شیشەوە دەخەین،
بۆ وەی وشک بێتەوە.
وەک سیگار دەیپێچینەوە و،
بە نۆرە مژی لێ دەدەین و، دوکەڵ بە با دەکەینەوە!.

--------------------

'9'. زەنگبار و تانگانیکا: پێشتر، دوو وڵات بوون و، لە ساڵی 1964 یەکیان گرت و، کۆماری تانزانیایان پێکهێنا.
'10'. دادا و کاکا: بە زمانی سەواحیلی، کە زمانی فەرمی تانزانیایە. واتە: خوشکێ/ دادە و، کاکە، کە لە زمانە ئێرانییەکانەوە وەرگیراوە.



جارێک، چووم بۆ گەشت.
بە دیوانی گۆرانەوە: دیتم، سروشتی نێو چەمەن و بەندەن و دەشت.
بە مەقلّییەکەوە، لای کەناراوەکانی ڤیکتۆریا'11' دانیشتم،
حزوورخواییم بۆ سادق هێنایەوە، بۆ دوو شیشە گۆشت.
دوایی، بە کەشتییەک، چوومە پۆرت لۆئیس،' 12' لە نێویدا:
شیعرەکانی لۆرکام خوێندەوە...
ڕێک "بەکر عەلی"م بیرکەوتەوە، کە شەهید کرا.
چەند شەوێک، لە ئەنتاناناریڤۆ،'13' چوومەتە سەر گۆڕی " ژان- ژوزێف"،'14'
شیعری "نامەیەک بۆ خوا"ی شێرکۆم بۆ خوێندۆتەوە.
بۆ سبەی دوا ئێوارەکەی، لە مۆرۆنی'15' بووم.
بە یادی زەریای هیندی، ماسییەکم سوور کردبۆوە.
وەک ژەنەراڵی پاییز، بە یادی تانجەڕۆ، قوڵابم خستبووە نێو ئاوەکەوە.
خۆشتر لەوە، ئەو خێڵەکییانەی وێ... وایاندەزانی من بازرگانێکی شیرازییم،
هاتبم، بۆستان و گوڵستانی سەعدی، بە خەڵک بفرۆشمەوە.
دوایی زانیان کە من کوردێکم و، بۆ وە هاتووم،
لە گشت وڵاتانی ئەفریقادا: هەردوو چامەکەی نالی و سالم بخوێنمەوە!.

---

'11'. ڤیکتۆریا: مەبەست لە پایتەختی وڵاتی "سیشێل"ە. لە باکووری ڕۆژهەڵاتی دوورگەی 'ماهێ' هەڵکەوتووە، لە نێو زەریای هینددا.
'12'. پۆرت لۆئیس: پایتەختی وڵاتی "مۆریس"ە. لە نێو زەریای هینددا.
'14'. ئەنتاناناریڤۆ: پایتەختی وڵاتی "ماداگاسکار"ە. لە نێو زەریای هینددا.
'15'. ژان-ژوزێف ڕابیاریڤیلۆ: شاعیرێکی ماداگاسکاری بووە. لە: 4/3/1901 لە ئەنتاناناریڤۆ، لەدایکبووە و، لە: 23/6/1937 ماڵاوایی کردووە و، لە هەمان شار، بە خاک سپێردراوە.



ڕەنگیش، لە جۆردا: پۆزی بە ڕەش و سپییەوە لێ دەدا.
وەک ئەو کوڕە ڕەشپێستەی مۆزامبیق،
کە بە تاقمەیەک ددانی سپییەوە، زاری دەکردەوە:
هەرچی ڕەنگ بوو، بەسەر لێوی ئەستووریدا دەڕژا و،
شینومۆر دەبۆوە، لە پێکەنیندا!.



ئەو کچە مالاوییەی، بە شەبقەیەکی هەسیرییەوە دەرکەوت:
یەکەم لێدوانی ئەوەبوو،
گوتی: ئەو کوڕەی وێنەی منی چرکاندووە:
لە حەمام، سەد دانەی لێ شۆردۆتەوە!.



به تراكتۆرێكی شرەوە، ڕۆژ تا ئێوارە:
ئەو دەشتە كشتوكاڵیانەی نێو زامبیام دەكێڵا.
چ جووتیار بوو، گەنمیان پێ دەكرد، تا قاتوقڕی ڕوو نەدا.
لەوان وابوو، من یوسفم و، هاتبم بۆ وەی:
بە تەفسیری خەونێكەوە، وڵاتیان بۆ بوژێنمەوە.
هەتا ڕاوچییەكان، دەست نەگرنەوە بەسەر وڵاتدا.
تاكوو مس و پۆڵا، ئاودیو نەكەنەوە، بەولا و لادا!.



بەیانیان، لە تەڕەباری کارم دەکرد: بەس قارچکم دەفرۆشت.
لەوێ، کووزەڵەم، هەر وە چنگ نەدەکەوت.
ئەو ژنە مەمک چرچ و شۆڕانەی دەهاتنە لام:
داوای دوو دەسکە کەوەریاْن لێ دەکردم،
وەک ئەوەی هیچ دڵۆپە خوێنێک لە لەشیاندا نەبێت.
یەکیان: کچکەی، گوارەی شینی لە گوێدا بوون،
دەترسام، لەوەی وەها تووشم بکات:
تەڕەبارەکەشی بۆ هەڕاج بکەم: بەشی شەوێکی ئەوم نەکات.
لە هەراری'16'، بەرگەم نەگرت و، ڕێم لە گابۆرۆن'17' نا.
لەوێ سەرقاڵ بووم بە نیکڵ و پۆڵا.
دوای ماوەیەک، ڕێم کەوتە کیمبیرلی،'18'
لە چاڵە گەورەکەدا هەر ئەڵماسم دەردەهێنا. دەگەڵ پاشای لیسۆتۆ'19' دانیشتم،
ڕێکەوتم جلوبەرگ و پێڵاوی وێ، هەناردەی بکەم، بۆ نامیبیا.
کە ڕێشم کەوتە نیشتمانی سوایزلەندە: پاشای سێیەمم بینی،
گوتی، ئەوە بۆ نەهاتبووی، خۆ ژنی چواردەیەمیشم هێنا!.
منیش بە پێکەنینەوە، پێم گوت:
گەر لە کوردستان دەژیای، دەمێک بوو، ڕەزگیان دەنای!.

----------------------------------

'16'. هەرارێ: پایتەختی وڵاتی "زیمبابوی"یە.
'17'. گابۆرۆن: پایتەختی وڵاتی "بۆتسوانا"یە.
'18'. کیمبیرلی: ناوچەیەکە، دەکەوێتە وڵاتی ئەفریقای باشوور.
'19'. لیسۆتۆ/ لیسووتوو: وڵاتێکی شانیشینییە. لە نێو وڵاتی ئەفریقای باشووردایە.



به بێدەنگی، ماوەیەکی زۆر لە کەرتی کابیندا'20' دەژیام.
قووماشی پورتوگالیم لە سائۆتۆمێ' 21'ڕا دەهێنا:
ئیشی دوورینم دەکرد.
یەکێ، بە قەوچەقەوچی بنێشتەوە، دەیگوت:
با هی من شێوازی پەڕپەڕی بێت.
یەکێ، بە سەرپایەیەکی دڕاوەوە، دەیگوت:
من لە خێڵکەی ئەوبەرم، با سوننەتی بێت.
کچێکی ڕەشتاڵەش دەهاتە لام، کە کەمەرم دەگرت،
بزانم چەند سانتیمە: ڕێک پاڵ دەکەوت.
وەک ئەوەی من لە نێو هیندییە سوورەکان ڕا هاتبمەوە:
هەمیشە بە دوو پەلکە گەڵا، ستیانی دەبەست.
لە بری قووماش: ڕۆژنەبوو، پەنجەم بەر دەرزی مەکینە نەکەوێت.
لە باتی پشوو: شەونەبوو، چاوم بە مەمکی خڕ نەکەوێت!.

---

'20'. کابیندا: ناوچەیەکی دابڕاوە و، سەر بە "ئەنگۆلا"یە. لە نێوان: "کۆماری دیموکراتیی کۆنگۆ و کۆماری کۆنگۆ"دایە. بەسەر زەریای ئەتلەسیدا دەڕوانێت.
'21'. سائوتۆمێ: پایتەختی وڵاتی "سائۆتۆمێ و پرینسیپی"یە. وڵاتێکی دوو دوورگەییە. کە نێوی وڵاتەکەش ئەو دوو دوورگەیە. لە نێو زەریای ئەتلەسدایە.



بەیانیان، ڕۆژنامەم دەگێڕا لە کینشاسا.'22'
بە ڕێکەوت، ڕۆماننووسەکانی وێم دیتن، لە قاوەخانەیەکدا.
باسمان لەو ڕۆمانە کوردییە کرد:
کە محەمەدی دڵشووشە،
دەنکە هەناری، ڕژاندۆتە سەر سینیی هەموو ماڵێکی دونیا.
ئینجا لێی پرسیم: وەک بزانیت،
کەی وەڵامی نامەکەی شێرکۆ دەدرێتەوە، لە لایەن خودا؟!.
گوتم: جارێ ماویەتی، ئەوەنییە شەنگال و کۆبانێ،
بوونەتە سەردێڕی گشت ڕۆژنامەکانی دونیا!.

---

'22'. کینشاسا. پایتەختی وڵاتی "کۆماری دیموکراتیی کۆنگۆ"یە.



وەک گەلی توواْ، '23'هەمیشە من، خوێنم زیاتر لێ دەچۆڕا:
لە چاو، هوتوویی و توتسییەکان، '24'
کە قەساپەخانەیان دانابوو، لە بۆروندی و ڕواندا.
هەر جارەو یەکیان، بە بیانووی زۆرینەوە:
ئەوی دی دەسڕییەوە، منیش بەردەکەوتم: وەک گەلی توواْ!.

-----------------------------------------------

'23'. توواْ: گەلێکی کەمینەن، لە: ئۆگەندا و ڕواندا و بۆروندی، دەژین. قوربانی دەستی هوتوو وتوتسییەکانن.
'24'. هوتوو و توتسی: دوو گەلی جیاوازن. لە ڕواندا: هوتووەکان، زۆرینەن و، لە ساڵی 1994 هەوڵی لە نێوبردنی توتسییەکان دا. هەروەها، لە بۆروندی: توتسییەکان، زۆرینەن و، ئەوانیش، لە ساڵی 1972 هەوڵی لە نێوبردنی هوتووەکانیان دا.




لای بانگی شێوان، لە نێو دوورگەی بولاگۆی'25' زرێچەی ڤیکتۆریا:
چای ئۆگەندیم دەخوادەوە.
خۆشتر کە لەسەر پردە تەختەکە دادەنیشتم،
بە یادی گەمەی منداڵییم، هێندێک جیرەجیرم پێ کرد:
قوڵەڕەشێکی وێ، هێندەی پێبکەنێ، خەریکبوو دەپسا!.
دوایێ گوتی: ئەها ئەوە ئێوە بوون، ئینگلیستان ناچار کرد:
چەند گەریدەیەکی ناردنە کوردستان و،
وشەیەکیان بە ئەو دەنگە دانا!.

--------------------------------

'25'. بولاگۆ: دوورگەیەکە، لە نێو زرێچەی ڤیکتۆریا. بەشی وڵاتی ئۆگەندا. کە ئەم زرێچەیە، دەکەوێتە نێوان: تانزانیا و کینیا و ئۆگەندا.




بە ڕادیۆیەکی قیسارەوە،
لە گوندی نگانگالا، خوار جوبا:'26'
چەند سەرێک بزنم وێدرابوو،
بیانلەوەڕێنم، جگە لە مەڕ و مانگا.
هەم شوان و هەمیش گاوان بووم.
هەر خەریکی دۆشینی گوانیان بووم.
ئیدی ئەو ژنانەی وێ، هەموو شەوێ:
حەزیان دەکرد: مەمکیان، بخەنە بەر دەستانم!.

----------------------------------

'26'. نگانگالا: گوندێکە، لە خوار جوبای پایتەختی "سۆدانی باشوور."



گوڵەبەڕۆژە، هەر خەریکی زیکرە.
بەردەواٖم بە دوای نوورەوەیە.
کە سێبەریش بدات لێی،
وەک عاریفێک دەچەمێتەوە.
کاهوو، کە حەز بە خرمەخرم دەکات،
بۆ وەی بە نێوی جوینەوە:
تەواف بە نێو ددانەکاندا بکات.
خەیاریش لە ڕقان،
لەسەر کوڵمەی کچان، خۆی قاش قاش دەکات.
وەک ئەو کچە بانگوئییەی،'27'
بە بەرچاوی هەمووانەوە:
خۆی هەڕاج دەکات!.

---

'27'. بانگوئی: پایتەختی "کۆماری ئەفریقای ناوەڕاست"ە.



وای... چەند سەختە بیستن، لە: کۆماری کۆنگۆ.
چەکدارە توندڕەوەکان،
دەستدرێژیان دەکردە سەر ژنان.
ماسیکا،'28' دەیگێڕایەوە: کیر و گونی پیاویان دەبڕی و،
دواتر دەرخواردی ژنەکانیان دەدران.
زمانم لاڵ بوو، مرۆڤبوونم شەرمەزاری نواند،
هێچ شتێکم پێ نەبوو بۆ گوتن:
ئەو ڕۆژە، هەر تفم بەخۆ دەکرد،
لە جیاتی، گشت پیاوە ئاژەڵییەکان!.
حەزم دەکرد؛ تیر بە دڵی خۆی، ئەنجن ئەنجنم بکات،
لە تۆڵەی گشت ناپیاوە زۆردارەکان!.

---------------------------------------------

'28'. ڕیبیکا ماسیکا کاتسوڤا: لە: 26/5/1966 لە کۆماری کۆنگۆ لەدایک بووە و، کە بە دایکە "ماسیکا" ناسراو بوو. ئەو خۆشی یەکێک بووە لە قوربانییەکان. لە: 1988 دەستدرێژی کراوەتە سەری و پیاوەکەیان بە بەرچیاوییەوە کوشتووە. لە: 2/2/2016 ماڵاوایی کردووە.



بەو چرقەی گەرمایە، ڕەشماڵێک هەڵدەدەم لە: گابۆن.
وەک قەرەجەکانی لای خۆمان،
بە زمانی فانگ،'29' گۆرانی واکا واکای شاکیرا دەڵێمەوە.
هێڵی ئیستوا، بەنێو دڵمدا تێپەڕ بووە.
گەر گۆرانی نەڵێم و تۆزێک خێڵەکییانە هەڵنەپەڕێم:
ئەی ئەو پلە گەرمییەی وێ، چۆن چۆنی دامرکێنمەوە!.

---

'29'. فانگ: زمانێکە سەر بە خێزانی "نێجر- کۆنگۆیی"، لە زمانەکانی بانتۆ.
نەتەوەیەکیشن، لە: وڵاتانی: "گابۆن و کۆماری کۆنگۆ و گینێی ئیستوایی و سائۆتۆمێ و پرنیسپی و کامیرۆن" دەژین. زیاتر لە ملیۆنێک کەس، بەو زمانە قسە دەکەن. کە زمانی فەرمی "گینێی ئیستوایی"یە، لە پاڵ ئیسپانی و پورتوگالی. هەروەها، وشەی "واکا واکا"، کە شاکیرا، بە گۆرانی گوتوویەتی: سەر بەو زمانەیە.




سواری پاسێکی شین دەبم و، لە باتا'30' دادەبەزم:
ڕێک بەرانبەر زەریا، شیعرەکانی "هیوا قادر" دەخوێنمەوە.
ئەتۆش، دەگەڵ دۆلفینێکدا گەمە بکە،
منیش، لەوبەرەوە: لە بری وێنەت بکێشمەوە،
گمەی کۆتر، دەخەمە نێو ڕستەیەکی شیعرەوە.
وەک دوو باڵی سەروادار، باڵندەکانی وێی، پێ هەڵدەفڕێنمەوە.
بۆ وەی کە لە گەمەکە وەڕەز بوویت،
دەگەڵ مندا، سواری پاسە شینەکە بیتەوە!.

-----------------------------------------

'30'. باتا: شارێکی گەشتیاریی وڵاتی "گینێی ئیستوایی"یە، بەسەر زەریای ئەتڵەسدا دەڕوانێت.



له نێو قوتابخانەیەکی سەرەتاییی شارۆچکەی مارۆوا'31' وانەم دەگوتەوە.
لەسەر تەختە ڕەشەکە:
بە تەباشیرێکی سپی، نەخشەی خوێنڕشتنی سوورپێستەکانم دەکێشایەوە.
یەکێ لە قوتابییەکان هەستا و، گوتی:
دەتوانی سەرەتای گشت ڕەنگەکانم بۆ شی بکەیتەوە!.

-----------------------------------------------

'31'. مارۆوا: شارۆچکەیەکە، لە نێو وڵاتی "کامیروون"دا.



که ئەو کتێبەی "چینوا"م،'32' خوێندەوە،
ئەوسا زانیم، چ جەنگێکی سیاسیی هەڵگیرساوە.
چەندە ڕۆح لە نێجیریا تێکشکێنراوە.
ئەوەنییە ئێستاش، بۆکۆ حەرام، بە نێوی دیینەوە:
شمشێرێکی گرتۆتە دەست و، دژی هەموو ئایینێک ڕاوەستاوە!.

---

'32'. چینوا: ئالبێرت چینوالومۆگو ئاچەبێ، شاعیر و ڕۆماننووسی نێجریا و باوکی ئەدەبیاتی ئەفریقا. لە: 16/11/1939 لە نێجریا، لە دایکبووە و، لە 21/3/2013 لە ئەمریکا، ماڵاوایی کردووە. کتێبەکەی، بە نێوی: "هەموو شتێک لێک دەترازێت" کە ساڵی 1958 بە چاپ گەیشتووە.



به دوای ئیشێکدا دەگەڕام، بوومە شاگردی دووکانێکی کۆمپیوتەر
وەها فێر ببووم، شەوانە دەچوومە سەر خەت، تا بوومە هاککەر
شەوێکیان کامێرای لاپتۆپەکەی "ئیدریس دێبی"م،'33' کردەوە:
هەر مینگەمینگی بوو، کە لە دژی دەسەڵاتی، هاوکاریی یاخیبووانیان داوە.
بەو هۆیەوە زانیم، کە دەگەڵ عومەر بەشیر، پەیوەندی دیپلۆماسییان پچڕاوە!.

---

'33'. ئیدریس دێبی: لەدایکبووی 1952یە. سەرۆک کۆماری وڵاتی "چاد"ە، لە ساڵی 1990 وە، تاکوو ئێستاکە.



تۆڵەی مەیموون، لەو ئاژەڵە گۆشتخۆرانە دەکەمەوە:
کە لە نێو دارستانەکانی بێنین و بورکینا فاسۆ،'34'
کەڵپیان لێ تیژ کردبوون و، کردبوویانە فلیمی سینەما.
نەیانزانی بوو، کە زەڕافە، ملی هێندە درێژە:
لە نێجەرەوە، سەری قیت کردۆتەوە و، تەماشایان دەکا!.

-----------------------------------------------------

'34'. بێنین و بورکیا فاسۆ و نێجەر: سێ وڵاتی دراوسێن، دەکەونە بەشی ڕۆژاوای ئەفریقا.



هەموو لۆمەی ئەوەیان دەکرد، کە چوومەتە لۆمێ:'35'
یاری گۆڵفم کردووە،
بە گۆچانی یەکێ لە پیاوە پیرەکانی وێ.
منیش بەو نیەتەوە تۆپە پەڕۆکەم،
بۆ دووری سێسەد یارد هەڵدەدا:
تاکوو لەوبەری چاڵەکەی گانا، تۆپەکە بێنمەوە دەرێ!.

-----------------------------------------------

'35'. لۆمێ: پایتەختی وڵاتی "تۆگۆ"یە و، دراوسێی وڵاتی "گانا"یە.



**لە: سان پێدرۆ،'36' هەر خەریکی چنینی زەمبیلە و سەبەتە بووم.**
**هەندێکیان، بۆ وە دەهاتن، وەها گەورەی دروست بکەم:**
**ئەناناسی تێ ڕا بێنن.**
**دوو کورتەباڵاش وە ژوور کەوتن، بە دەنگێکی بۆڕەوە قسەیان کرد:**
**با ئەوەی مە، قووڵ بێت... لۆکەی تێ دەکەین.**
**ئەو هەتیوانە، بە دەنگیان ڕا دیاربوو،**
**شەو و ڕۆژ، هەر خەریکی پەڕین بوون!.**

---

**'36'. سان پێدرۆ: شارۆچکەیەکە، لە وڵاتی "کۆتدیڤوار"، کە بەسەر زەریای ئەتڵەسیدا دەڕوانێت.**



لە: بووچانان،'37' لە شیرینی و ساردەمەنییەک کارم کرد:
ئەوانەی دەهاتن، زیاتر داوای شەربەتی مێووژیان دەکرد.
کچۆڵەیەکی باڵابەرزی چاوڕەشیش دەهاتە لام:
وەها مەستی کردوبووم، شەربەتەکەم لە شیرینی چاوی ئەو تێ دەکرد.
موشتەرییەکانیش، گشتیان ساختەچی بوون،
دوای زانیم، بە بێنووی چاوی ئەوەوە: گیرۆدەی شەربەتەکە بووبوون!.

------------------------------------------------------

'37'. بووچانان: شارۆچکەیەکە، لە وڵاتی "لیبێریا"، دەکەوێتە: سەر زەریای ئەتڵەسی.



ئاسمان، هەوری چڕی هەڵبەست بوو،
هەورەبروسکەیەکی وەها هات: وامزانی دای لە تەپڵی سەرم.
کە ئاوڕمدایەوە: لە دارستانەکەی پشت فریتاونی'38' دابوو.
چووم، لە باتی: ئەڵماس دەرکەوێت، مامزێکی کوشتبوو.
دوای باران بارین، هەتاو، پڕژا...
پەلکەزێڕینە، لەسەر ملی مامزی داماو دەرکەوتبوو!.

-----------------------------------------------

'38'. فریتاون/ فری تاون: پایتەختی وڵاتی "سیرالیۆن"ە.



له چەمەنزارەکەی بۆکێ،'39' بە دوای پوونگ و نەعنادا دەگەڕام.
تا چاو بڕی کرد، تێر سروشت بووم.
خانۆچکەیەک، لەوبەرەوە هەبوو: بە دار دروستکرابوو.
ئەو ماڵەی وێ: لە نێو تەشتە فافۆنێکدا خۆیان دەشرد.
تەنافیشیان، چەند دار دولکێکی گەورە بوو،
ڕێک هاتەوە یادم، وەختی خۆی، بە دانەیەکی بچووک:
سەری زۆربەی منداڵانی نێو گەڕەکەکەمان، پێ شکاندبوو!.

-----------------------------------------------

'39'. بۆکێ: شارێکە لە ڕۆژاوای "گینیا".نەتەوەتەیەکیشن، کە لە ڕۆژاوای گینینا و، هەندێکیشی لە "سێنگاڵ و گینێ بیساو"دا، دەژین.



به چەنگێکی ماندایی،'40' لە ناوچە خێڵەکییەکەی کاسەمێنسدا:'41'
ڕۆچووبوومە نێو قووڵایی ڕۆحی مۆسیقا.
بە نێو دارستان و دێهاتی وێدا ڕۆیشتم.
ئەو خەڵکەی وێ: هەمووی نقوم ببوون لە ڕۆحدا.
وەک نەدیوبدییەک، جار جار، پەنجەکانم ماچ دەکردن:
کە چەنگی وێشم، وە ڕۆح هێنا!.

-------------

'40'. ماندایی: گرووپێکی نەتەوەییە، لە ڕۆژاوای ئەفریقا، نزیکەی 11 ملیۆن کەسن. کە لەم وڵاتانەدا هەن: گامبیا، گینیا، مالی، سیرالیۆن، کۆتدیڤوار، سێنیگال، بورکینا فاسۆ، لیبێریا، گینێ بیساو، نێجەر و مۆریتانیا.
'41'. کاسەمێنس: ئەو ناوچەیەیە، کە دەکەوێتە نێوان: " گامبیا و سێنیگال و گینێ بیساو."



به دونیابینینێکی دییەوە:
وەک هۆزی بۆزۆ،'42' چوومە نێو ڕۆحی دیینەوە.
هەندێک جار: وەک ئیسلامێکی سۆفیگەریی و،
هەندێک جاریش: وەک ڕۆحگەرایی دەجوڵامەوە.
جوانتر لەوە: ئەو پەرەسێلکانەی وێ:
کەنەفتی ڕەنگییان دەکێشایەوە!.

-----------------------------------

'42'. بۆزۆ: گرووپێکی نەتەوەیین. زمانی قسەکردنیان بۆزۆیە. کە زیاتر لە: "230 هەزار" کەس، قسەی پێ دەکەن. لە وڵاتی "مالی" دەژین. بەشێکی کەمیش، لە: نێجەر.



بۆ ماوەیەک، هاموشۆی نێجەر و چادم دەکرد:
بۆ وەی قوری باشم وە چنگ بکەوێت، کاری پەیکەرتاشی بکەم.
دوایی ملم لێنا بەرەو دارفوور، سەرقاڵ بووم بە پەیکەرتاشی و لەوێ گیرسامەوە.
لەو غەریبییەدا، دڵتەنگی وەهای لێ کردبووم:
لە پڕ کچێک، بە بەردەممدا تێپەڕی.
منیش، ئەم گۆرانییەم بە تێکەڵی بەسەر دەممدا هات:
"فاتیمە دوو چاوی مەستیت، پڕ لە غەریبیت، جوانییە.
بەژن و باڵات ئەفریقییە، هیچ فڕی بە سۆدانەوە نییە." '43'
کە گوێی لەم گۆرانییە بوو، گەڕایەوە و گوتی:
منیش ئەو کیژەم، دەک بەخێربێیت، کوڕە ڕۆژهەڵاتییەکە!.

---

'43'. دوو نیوە دێڕی شیعری "ست فاتیمە"ی، 'ئەحمەد هەردی"یە. بە دەستکاری و داڕشتنەوە.



ناپەڕێمەوە، بۆ: شەرم شێخ، جا چی شتێکم لەسەر نەبیستووە.
بەرپرسی کوردی وەهای بۆ چووە، بۆ تەڕە گان هەفتەیەکی پێ چووە.
لە بەردەم هەڕەمەکان، حزوورخوایی دەهێنمەوە.
نە خەونی یوسف دەگێڕمەوە،
نە وەک گەشتیار، بە ڕووباری نیلدا دەسووڕێمەوە.
تەنیا بۆ وە دەچم، هونەری بیناکاریی، بنووسمەوە!.



**بەسەر پشتی وشترێکەوە:**
**ڕۆیشتم بە نێو خاکی لیبیا و توونس و جەزائیردا.**
**هیچ حیکایەتێکم نەنووسییەوە.**
**دەمزانی وەک خۆڵی وێ: با دەمبات و نامهێنێتەوە!.**



به گەرووی جەبەل تاریقدا ناپەڕێمەوە.
لە مەغریبەوە، بە چەشنی مۆدێڕنە:
بە بیابانی ڕۆژاوادا'44' دەسووڕێمەوە.
بە قوڕگێکی وشک و، چاوی ڕۆشنمەوە:
بە تەنیا، لە دەرەوەی یەکێتیی ئەفریقا، دەمێنمەوە!.
یان وەک بەربەرییەک، تاتۆیەک لە نێوان هەردوو برۆمدا دەکەم:
بۆ وەی بە ئاڵای نەتەوەکەم، بمناسنەوە!.

----------------------------------------

'44'. بیابانی ڕۆژاوا: وڵاتی "سەحرای ڕۆژاوا"یە.



وەختی بەرەبایانی زوو،
فریزوو، بە ئاونگ دەستنوێژی هەڵگرتبوو.
منیش، چوومە مزگەوتی نەوازیبۆو،'45' بۆ دوو ڕکات نوێژی بەیانیی،
کە هاتمە دەر، وەک لای خۆمان، جووتە پێڵاوەکەم دزرا بوو!.

-----------------------------------------------------------

'46'. نەوازیبۆو: مزگەوتی شاری "نەوازیبۆو"ە. لە وڵاتی: مۆریتانیا.



له دوایین سەفەرمدا، له: پرایا،'47' یاپراغم بە ویستی خۆم پێچایەوە.
له چینی بنەوە: ماسییەکی بەندەریم ڕاخست، کەمێ ترشم پێ کرد.
چینی دووەم: لۆبیا، نەختێك دۆشاوی تەماتەم بەسەردا کرد.
له بری: گەڵامێو، پەلکەگیای توورم هێنا:
له جیاتی: برنجیش، ساوەرم بۆ خووساند و دە نێو وێم کرد.
کۆتا چینیش... مێشکی قرژاڵم، بەسەردا ڕۆکرد.
ئیدی بە تامی خواردنەوە: ماڵاواییم، له قارەی ئەفریقا کرد!.

---

'47'. پرایا: پایتەختی وڵاتی "کەیپ ڤەرد"ە. له نێو زەریای ئەتڵەسدایە.

"1 / 7 / 2016 - 15 / 8 / 2016" قەڵادزێ

تێچنین: لە ژوورێکی 3 بە 4م، نووسراوە. هیچ وڵاتێکی ئەفریقام نەدیوە.

لە: هەر سێ وێبسایتی: "کولتوور-مەگەزین، قەڵەم، هسارە"د، بڵاو بۆتەوە.

www.culturemagazine.org

www.qelam.com

www.hisare.com

ئەم ئەزموونەم خوێندۆتەوە، کە ناردبووت، ئەزموونێکی سەیرە و لە سوبێکتێکی شیعری پڕ نیگەرانی بەرامبەر جیهان و بێ ئۆقرەیی لەگەڵ شوێن و دونیادا ئاوێنە یی دەکاتەوە... من بە دڵم بوو، هەرچەندە تێبینییم هەیە لەسەری بەڵام تێبینییەکان لە ئاستی ئەزموونەکە جارێ بێدەنگی پێویستە. وا هەست دەکەم دوای ئەم ئەزموونە، کاری گەورەتر دەنووسیت.
ئەم ئەزموونەی تۆ، سێ کتێبی شیعری گەورەی ئەدۆنیسی بیرخستمەوە بە ناوی (امس الكتاب الان 1 ، 2، 3) کۆی مێژووی عەرەبی لەو سێ کتێبەدا بە وردی نووسییوە، چیتر شیعر تەنها ڕازی دڵ نییە... بەڵکوو ترپەیەکی مێژووە.

## ئیسماعیل حەمەئەمین

ڕۆماننووس، نووسەر لە بواری فیکری ڕەخنەییدا.

•••••••••••••••••••••••••

بە ڕاستی تۆ لە شێعردا، لە نوێبوونەوەیەك دەگەڕێیت،
کە داهێنانی تێدایە و، بە بە داهێنەریش دەدرێیتە قەڵەم.
خەریکی بە نزیکبوونەوەی تاڵەموانە و ،
بەنداوی داهێنەری دەتەقێنیتەوە.

## لێکۆڵەر "ئەحمەد حەقناس"

•••••••••••••••••••••••••

فیعلەن دەڵێی گەشتێکی باشت بەو سەواحیل و وڵاتە ئەفریقاییانەدا کردبێت. خۆ بە ڕای من گەر بتنووسیبا پەخشان، ئەوە ڕەگەزەکەیت بە دروستیی دیاریی دەکرد.
خۆت دەزانی یەکێك لە جیاوازییەکانی نێوان شیعر و پەخشان،
کارکردنە لە شعور و لاشعوردا
. دەقێکی ئەدەبیی جوانە و پاشخانی زانستیی و ئەدەبی باشت هەیە
و سەرنج ڕاکێشیشە.
لە هەر بارێکدا، دەقێکی ئەدەبییە و قبووڵە.

## شاعیر و ڕەخنەگر: ئەحمەد ڕەزا










# ئیبراهیم صاڵح

## بۆ دیزاینی ...

- گۆڤار
- ڕۆژنامە
- بەرگی کتێب
- پۆستەر
- لۆگۆ
- برووشەر
- بزنسکارت

**پەیوەندی بکەن بە ... 07501935648**










